





# ٧٠ خاڵی گرنگ سەبارەت بە

## نۆمینەی حاجیان و ئەحکامەکانی

# قوربانی کردن









## خولی سیانزەیەمی پێشبڕکێی

# کەناڵی بەکورتی

تایبەت بە نۆمینەی حاجیان و حوکم و ئادابەکانی قوربانی





بسم الله الرحمن الرحیم

**خوشک و برایانی بەڕێز** : کەناڵی (**بەکورتی**) لە تلیگرام تایبەتە بە بڵاوکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان بەکورتی و پوختی ، سوپاس بۆ خوای گەورە لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵ (٥٥٠) بابەت و حوکمی شەرعی گرنگی تێدا بڵاو کراوەتەوە و ڕۆژانەش بەردەوامە لە بڵاوکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان ، وە لە ئێستادا زیاتر لە (١١٠٠٠) یانزە هەزار لە خوشک و برایانمان هاوڕێمانن لەم کەناڵە گرنگە .

جا بۆ سوودی زیاتر ماوە ماوە وەکو ستافی کەناڵ پێشبڕکێیەک ساز دەکەین بۆ ئەندامانی بەڕێزمان و کۆمەڵێک خەڵات و دیاریش ئامادە دەکەین بۆ سەرکەوتووان .

**ئێستاش پێشبڕکێی خولی سیانزەیەم ڕادەگەیەنین بەم شێوەیە :**

١. تەنها ئەم کتێبەی بەردەستت داخلە بۆ تاقی کردنەوەکە و پێویستە بیخوێنیتەوە.

٢. لەم کتێبە (١٥) پرسیارمان دەرهێناوە بە شێوەی هەڵبژاردن و ڕاست و هەڵە بە شێوەی ئۆنلاین ئاڕاستەتان دەکرێ .

٣. تاقی کردنەوەکە لەسەر (١٠٠) نمرەیە بەم شێوەیە :

أ. (٤٥) نمرە بۆ پرسیارەکان واتە هەر پرسیارێک سێ نمرەی لەسەرە.

ب. (٣٠) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کە ئەم کتێبە هەمووی دەخوێنێتەوە.

ج. (٢٥) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کە لینکی کەناڵی (بەکورتی) دەنێرێ بۆ پێنج لە هاوڕێکانی ، یان پێنج هاوڕێی ئاگادار دەکاتەوە لەم پێشبڕکێ یە.

واتە : گەر ئەم کتێبە بخوێنیتەوە و بینێری بۆ پێنج لە هاوڕێکانت و ئاگاداریان بکەیتەوە لەم پێشبڕکێ یە ئەوا (٥٥) نمرەت مسۆگەرە .

٤. کاتی دەست پێکردنی تاقیکردنەوەکە ڕۆژی (٧ی مانگی حاجیان) واتە سێ ڕۆژ پێش جەژنی قوربان لە دوای نوێژی عەسر دەبێت و بۆ ماوەی (سێ ڕۆژ) فۆرمەکە داناخرێت.

٥. لەکاتی تاقیکردنەوەکە نابێت سەیری کتێبەکە بکرێت چونکە پرسیارەکان ئاسانن .

٦. خەڵاتەکان بریتی دەبێت لە پێنج تەفسیری ڕێبەر .



**ئامانج لەم پێشبڕکێیە تەنها بردنەوەی خەڵات نیە بەڵکو بۆ زیاتر تێگەشتن و شارەزابوونە لە حوکمە شەرعییەکان کە ئەمەش باشترین خەڵات و دیارییە .**

# بەشی یەکەم

## فەزڵ و گەورەیی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان

١-خوای پەروەردگار فەزڵ و ڕێزی هەندێ کات و ڕۆژ و مانگی داوە بەسەر ئەوانی تردا ، فەزڵ و ڕێزی دەڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیانی داوە بەسەر ڕۆژەکانی تردا و لەناو ئەو دە ڕۆژەشدا ڕۆژی جەژنی قوربانی داوە بەسەر نۆ ڕۆژەکەی تردا ، وباشترین ڕۆژەکانی حەفتە ڕۆژی هەینی یە ، وباشترین شەوەکان: دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە ، و لەو دە شەوەشدا شەوی قەدر باشترینیانە .

٢- خوای گەورە لە ساڵ و کاتەکاندا جۆرەها دیاری و هەلی داناوە بۆ بەندە یەکخواپەرستەکانی ، لەوانە: دەڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان ، ئەم دە ڕۆژە یەکێکە لەو کاتانەی کە عیبادەت کردن تیایدا ڕێز و قەدرێکی تایبەتی هەیە .

٣- چاکەکردن لە دە ڕۆژی سەرەتایی مانگی حاجیان لەهەموو ڕۆژەکانی تری ساڵ باشترە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:((مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ الْعَشْرِ ، فَقَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ)) [1]

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٩٦٩) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٧٥٧) واللفظ لـهُ .

واتە : هیچ ڕۆژانێك نییە کردەوەی چاکە تێیدا خۆشەویست تر بێت لە لای خوا وەکو ئەم دە ڕۆژەی مانگی حاجیان ، وتیان : تەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ؟

فەرمووی : تەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ، تەنها مەگەر پیاوێك نەبێت کە بە خۆی و ماڵ و سامانییەوە دەربچێت بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا و هیچیش لەوانە نەگەڕێتەوە.

٤- عیبادەتە فەرزەکان لەم دەڕۆژەدا خێریان زیاترە بەبەراورد بەڕۆژەکانی تری ساڵ ، وپاداشتیان زۆرترە ، وبەهەمان شێوە سوننەت لەم دەڕۆژەدا خێری زیاترە بەبەراورد بەڕۆژەکانی تری ساڵ ، وپاداشتی زۆرترە[1]

٥- نوێژ کردن لەم دەڕۆژەدا خێری زیاترە بەبەراورد بەڕۆژەکانی تری ساڵ ، و پاداشتی زۆرترە ، و بەهەمان شێوە ڕۆژوو ، وقورئان خوێندن ، و نزاو پاڕانەوە ، و خۆشکاندن بۆ خودا ، و چاك بوون لەگەڵ دایک وباوکدا ، و گەیاندنی سیلەی ڕەحم و سەردانی خزم وکەس وکار بەم شێوەیە تا کۆتایی .

---

[1] الفتح الباري لابن رجب (٩ / ١٥) .

٦- فەزڵ وڕێزی ئەم دە ڕۆژە شەویش دەگرێتەوە ، بەڵام فەزڵی دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان لەدە شەوی سەرەتایی مانگی حاجیان زیاترە ، وڕۆژەکانی لەڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان فەزڵی زیاترە ، لەبەر بوونی ڕۆژی عەرەفە وجەژن و تەرویە تیایدا . [١]

٧- لەم دەڕۆژەدا جۆرەها عیبادەت کۆدەبنەوە کە لەمانگەکانی تردا بەو شێوەیە بوونیان یە ، وەک حەج وقوربانی کردن ، جگە لەنوێژ وڕۆژوو وخێر وسەدەقە . [٢]

٨- یەکێکە لەڕێز وفەزڵەکانی ئەم دەڕۆژە ئەوەیە: خوای پەروەردگار سوێندی بەشەوەکانی خواردووە ، هەروەک فەرموویەتی: ﴿ وَالْفَجْرِ (١) وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴾ [ الفجر : ٢] .

٩- یەکێکی تر لەفەزڵ وڕێزەکانی ئەم دە ڕۆژە ئەوەیە:

ڕۆژی عەرەفەی تێدایە ، ئەو ڕۆژەی کەخوای پەروەردگار دینی تیادا کامڵ وتەواو کرد ، ونیعمەتی خۆی بۆ موسوڵمانان تەواو کرد ، هەروەک فەرموویەتی: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴾[المائدة: ٣] .

---

[١] مجموع الفتاوى (٢٥: ٢٨٧) ، وبدائع الفوائد لابن القيم ( ٣/ ١٦٢) ، وزاد المعاد (١/ ٥٧) ، وتفسير ابن كثير (٥/ ٤١٦).

[٢] فتح الباري لابن حجر (٢/ ٤٦٠).

١٠- یەکێکی تر لەڕێزو فەزڵەکانی ئەم دەڕۆژە ئەوەیە: ڕۆژی حەجی گەورە (یوم النحر) ، و(یوم الحج الأكبر)ــی تێدایە ، کەگەورەترین ڕۆژە لەلای خودا ، هەروەک لەفەرموودەیەکدا هاتووە : **(إنَّ أفضلَ الأيَّامِ عندَ اللَّهِ يومُ النَّحرِ ثمَّ يومُ القرِّ )** [1] واتە: باشترین ڕۆژەکانی لەلای خودا ڕۆژی قوربانی کردنە پاشان ڕۆژی دوای ئەوە .

و بۆیە ڕۆژی دواتر ناونراوە (يومُ القرِّ) لەبەر ئەوەی خەڵک لەو ڕۆژەدا جێگیر (يستقر) دەبن لە(منى) .

١١- سەلەف ڕەحمەتی خوایان لێ بێت زۆر سوور بوون لەسەر هەوڵدان وعیبادەت کردن لەم دەڕۆژەدا ، وزۆر بەگەورەیان دادەنا .

لەوانە سەعدی کوڕی جوبەیر کاتێ ئەم دەڕۆژەی بەسەردا دەهات زۆر عیبادەتی ئەنجام دەدات ، بەشێوەیەک خەریک بوو توانای بەسەردا نەمێنێ ، ولەو دەشەوەدا خەڵکی هەڵدەنا لەسەر عیبادەت ودەیفەرموو: **((لا تُطْفِئُوا سُرُجَكُمْ لَيَالِي الْعَشْرِ))** [1] واتە : شەوانی دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان چراکانتان مەکوژێننەوە [مەبەستی ئەوەیە : شەونوێژ بکەن و قورئان بخوێنن و زیکری خوا بکەن] .

---

[1] رواه أبو داود (١٧٦٥)وصححه الألباني

[1] لطائف المعارف (٢٦٣) .

١٢- پێویستە لەسەر موسوڵمان ئاگاداری ئەم دە ڕۆژە بێت و لەدەستی نەدات ، و کردەوەی چاکی زۆر تێدا ئەنجام بدات ، و کاتەکانی بە شتی باش و خێر بەڕێ بکات، بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە لەمانگی ڕەمەزاندا چوست وچالاک بین ودواتر لەم دە ڕۆژەدا تەمبەڵی بکەین ، لەکاتێکدا ڕۆژەکانی لەڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان ڕێزدار ترە ، و کردەوە کردن تیایدا خۆشەویسترە بەلای خوداوە.

١٣- ئاممان ئاممان ئاگادار بن لەبەفیرۆدانی کات لەم دە ڕۆژەدا و خۆ سەرقاڵ کردن بەشتی خراپ و بێ سوودەوە هاوشێوەی نوستن ، و وتی و وتی ، وتەماشاکردنی کەناڵەکان ، وسەرقاڵ بوون بە تۆڕە کۆمەلایەتیەکانەوە ، چونکە ئەم کاتانە غەنیمەت ودەستکەوت گەلێکی زۆر گەورەن و گەر لەدەستت بچێ قەرەبوو ناکرێنەوە .

١٤- باشترین کردەوە لەم دەڕۆژەدا :حەجە ، ئەو حەجەی کەخودا قەبوڵی کردووە، لەفەرموودەدا هاتووە: ( الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة) متفق عليه . واتە: حەجی وەرگیراو وقەبوڵ کراو هیچ پاداشتێکی نییە جگە لەبەهەشت نەبێت .

١٥- سوننەتە لەم دەڕۆژەدا زۆر زیکر ویادی خودا بکرێت ، لەهەموو کات وسات وبارێکدا ، بەدانیشتەنەوە بێت یاخود بەپێوە ، وپاڵکەوتنەوە ،وە بەسواری بێت یاخود بەپیادە .

١٦- زۆر وتنی (لا اله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) كردن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ما من أيام أعظم عند الله ولا أحب إليه العمل فيهن من هذه الأيام العشر فأكثروا فيهن من التهليل والتكبير والتحميد )[١] واتە: هیچ ڕۆژانێك نییە لای خوا گەورەتر بێت و كردەوەی تێدا خۆشەویست تر بێت لەم دە ڕۆژە، دەی زۆر (لا اله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) بكەن .

١٧- (الله أكبر) و (سبحان الله) و(لا إله إلا الله) كردن ؛ ئا ئەمانە پێیان دەوترێت: (الباقيات الصالحات) ، خۆشەویسترین وتەن بەلای خوداوە ،و باش وایە لەم ڕۆژانە دەنگ بەزیكر كردن بەرز بكرێتەوە ، وبەپێ و دانیشتنەوە ، وبەسواری وپیادە ، لەماڵ وڕێگاو بانەكاندا ، و لەمزگەوت و شوێنە گشتیەكاندا ، و لەبازاڕ وجێگای كاردا .

---

[١] أخرجه احمد(٧ / ٢٢٤) وصحّح إسناده أحمد شاكر .

١٨- (الله أكبر) كردن لەم دە ڕۆژە و هەموو جێگە و کات وساتێکدا دەکرێت ، لەهەموو ئەو جێگایانەی کەزیکر ویادی خودا تیایدا دروستە ، موسوڵمان بەئاشکرا دەیکات ودەنگی پێ بەرز دەکاتەوە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ [الحج : ٢٨]

بڵاوترین شێوەی (الله أكبر) كردن بەم شێوەیەیە **(الله أكبر ، الله أكبر ، لا إله إلا الله، الله أكبر ، الله أكبر ، ولله الحمد)** ، وئەم بابەتە مەجالی تێدایە ومەرج نییە تەنها بەم شێوەیە بێت .

١٩- ڕۆژوو گرتنی نۆمینەی حاجیان (هەر نۆ ڕۆژەکە)سوننەتە .

وە ڕۆژوو گرتن کەفارەتی تاوانە ، و پارێزە لەئاگر ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : هەر بەندەیەك لە بەندەكانی خوا ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت لە پێناوی خوای پەروەردگار ، ئیللا بە هۆیەوە خوای پەروەردگار ڕوومەتی لە ئاگری دۆزەخ ( ٧٠ ) حەفتا پایز ( واتە : ساڵ ) دوور دەخاتەوە .

٢٠- ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم و هەلێکی گەورەیە ، و تاوانی دوو ساڵ دەسڕێتەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : **( صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ**

**وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ)** [١] واتە : ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە چاوەڕوانم کە خوا بیکاتە مایەی کەفارەت و سڕینەوە و لێخۆشبوونی تاوانی ساڵێك لە پێشییەوە و ساڵێکیش لە پاشییەوە (واتە : ببێتە کەفارەتی تاوانی دوو ساڵ)

تێبینی : ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە لەشەوەوە نیەتی بۆ دەهێندرێت ، بەڵکو پاداشتەکە تەواو وبێ کەم وکورتی بێت .

٢٠- باش وایە ماڵ و منداڵ و کەسوکار لەسەر ئەم ڕۆژووە ڕابهێندرێن ، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەیگوت: **أيقظوا خدمكم يتسحرون لصوم يوم عرفة)** [١] واتە: خزمەتکارەکانتان بەخەبەر بێننەوە بەڵکو پارشێو بکەن بۆ ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە .

٢١- سوور بە لەسەر ئەوەی لەگەڵ ئاوابوونی خۆری ڕۆژی عەرەفەدا تاوانەکانت ئاوا ببن، ئەوەش بە دوعا کردن و پاڕانەوەی زۆر .

٢٢- یەکێک لە بازرگانییە پڕ خێر و قازانجەکان خەتم کردنی قورئانی پیرۆزە لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان ، چونکە خوای پەروەردگار

---

[١] رواه مسلم (١١٦٢) .

[١] حلية الأولياء (٢٨١) ، والسير (٤/ ٣٢٦).

بەهەر پیتێک دە خێر وچاکەت بۆ دەنوسێت ، و بێ گومان قورئان خوێندن لەم دە ڕۆژە خێری زیاتری هەیە .

هەروەها لە زیرەکی و تێگەیشتووی موسوڵمان ئەوەیە لەم دە ڕۆژەدا چەند جۆرێک عیبادەت پێکەوە کۆ بکاتەوە ، هاوشێوەی زیکر و نوێژ و بەخشین و دوعا و کاری چاکە بەگشتی.

٢٣- ئەو کەسانەی کە نیازی قوربانی کردنیان هەیە لە یەکەم ڕۆژی مانگی حاجیانەوە نابێ دەستکاری مووی لاشە و نینۆکیان بکەن تاوەکو قوربانیەکەیان سەر دەبڕن ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی : ئەگەر مانگی زولحیجەتان بینی وەکەسێک لە ئێوە ویستی قوربانی بکات با دەست بگرێتەوە لە موکردنەوە و بڕینی نینۆکەکانی.

٢٤- هەر کەسێک بزانێت ئامانجەکەی چیە لە دنیادا ئەو کات هەوڵی بۆ دەدات و خۆی بۆ ماندوو دەکات ، گومانیشی تێدا نیە ئامانج و هەدەفەی گەورەی کەسی موسڵمان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشتەکەیەتی ، دەی با پەلە بکەین لەئەنجامدانی کاری چاکەدا ، و هەموو تەوبە بکەین وبگەڕێینەوە بۆ لای خودا ، و با ئەم دە ڕۆژە بکەینە خاڵی وەرچەرخان وهەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لەگەڵ خوای گەورەدا .

٢٥- کاری چاکە ودوور کەوتنەوە لەتاوان لەم دە ڕۆژەدا ، موسوڵمان ڕادەهێنێت لەسەر بەگەورە دانانی شەعائیرەکانی خودا ، و پارێزگاری کردن لەسنورەکانی ، ئەم دە ڕۆژە لەمانگە حەرامکراوەکانە ، خوای پەروەردگار لەبارەی مانگی حەرامکراوەوە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ﴾ [التوبة: ٣٦].

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾ [الحج : ٣٢] هەر کەسێك دروشمەکانی دین و فەرمانی خوای گەورەو حەج کردن بە گەورە بزانێ، ئەمە نیشانەی تەقوای دڵی ئەو کەسەیە کەسێکە تەقوا لە دڵیدایە.

**لە کۆتاییدا :** بزانە کە خێزان و ماڵ و منداڵمان ئەمانەتن لەگەردنمان ، دەی با هەوڵدەین گەورەیی ئەم کات و موناسەباتانە بە ماڵ و منداڵەکانمان ئاشنا بکەین ، و ڕایان بێنین لەسەر ڕێز گرتن لێی ، و ئەنجامدانی کاری خێر وچاکە تیایدا ، و با هەل و دەرفەتەکان لەدەست نەدەین ، و کار بکەین پێش لەدەست چوونیان .

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

# بەشی دووەم

## حوکم و ئادابەکانی قوربانی کردن

### پێناسەی قوربانی

١. قوربانی کە بە زمانی عەرەبی پێی دەوترێت: ( الأضحية ) بریتی یە لەو ئاژەڵەی کە سەردەبڕێت لە جۆری وشتر، مانگا، مەڕ وبزن لە ڕۆژانی جەژنی قورباندا وەکو نزیك بوونەوەیەك لەخوا.

بۆیە پێی دەوترێت ( الأضحية ) چونکە لەکاتی چێشتەنگاو (ضحى) یان بەرزبوونەوەی خۆردا سەردەبڕێت.

### کەی قوربانی بوو بە یەکێک لە دروشمەکانی ئیسلام .

٢. قوربانی لەساڵی دووی کۆچی شەرعێنرا و بوو بە یەکێك لە دروشمەکانی ئیسلام و بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە و یەکدەنگی زانایان.

خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾ [الكوثر]

وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگیربوە بە کردار وگفتار و موسڵمانانیش کاریان بەمەکردوە

## فەزڵ و خێری قوربانی کردن

٣. قوربانی کردن کارێکی شەرعییە و نزیك بوونەوەیەکی گەورەیە لە خوای پەروەردگار، وە دروشمێکی ئاشکرای ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، بۆیە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) و سەلەفی صاڵەحیش زۆر گرنگییان بە ئەنجامدانی قوربانی داوە بە شێوەیەك ئەو فەرموودانەی کە لە بارەی ئەنجامدان و ڕونکردنەوەی ئەحکامەکانیەوە هاتووە دەگەنە پلەی (التواتر الـمعنوي) چونکە زۆر زۆرن، وە پێغەمبەر (ﷺ) لە سەفەریشدا قوربانی ئەنجامداوە وەك چۆن کاتێك لە ماڵدا بوویێت، وە ئەمانەیش هەموو بەڵگەن لە سەر گەورەیی و فەزڵی ئەم کارە پیرۆزە ، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتووە سەبارەت بە دیاری کردنی بڕ و ئەندازەی پاداشتەکەی. پێشەوا **ابن العربی مالکی دەڵێت:**

( ... سەبارەت بە قوربانی خەڵکی شتی سەیر دەگێڕنەوە کە صەحیح نین).[1] بۆیە ئەوانەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا لەم بارەیەوە هەواڵ و ئەسەر دەگێڕنەوە وریای ئەم خاڵە بن.

[1] عارضة الأحوذي (٢٢٨/٦)

## حوکمی قوربانی کردن

٤. قوربانی لای زۆربەی زانایان سونNەتی جەختلێکراوە و هەندێکیش لە زانایان بۆ ئەوە ڕۆیشتوون کە واجبە کە ئەمە مەزهەبی ئەبی حەنیفە و ڕیوایەتێکە لە مالك و ئەحمەدەوە و وتەی پەسەندکراوی ابن تەیمیەیە، بۆیە ناشێت و ناگونجێت بڕوادارێك کە توانای هەبێت و قوربانی نەکات.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : ئەوەی توانای قوربانی کردنی هەیە و نایکات ئەوا با نزیك نوێژگەکەمان (مصلی) نەکەوێتەوە.[1]

کەوابوو باش وایە هەرکەس توانای هەیە و خوای گەورە ماڵێکی پێ بەخشیوە با ڕەزیلی لێ نەکات و هەموو ساڵێک قوربانی بکات و دڵی ماڵە هەژارەکان خۆش بکات و خۆی لەم خێرە گەورەیە بێ بەش نەکات .

## کێ دەتوانێ قوربانی بکات

٥.قوربانی کردن دروستە و مەشروعە بۆ هەموو خەڵکی: نێر، مێ، موقیم، ڕێبوار، گوندنشین، شارنشین، لەوڵاتی موسڵمانان بێت یان وڵاتی

[1] رواه ابن ماجه (٣١٢٣) مرفوعاً ، ورجَّح البيهقي والحافظ ابم حجر أنَّه موقوف على أبي هريرة .

بێباوەڕان. تەنها ئەو کەسە نەبێت کە لە حەجدایە – لای مالك – ئەوا قوربانی ناکات، بەڵکو هەدی سەردەبڕێت، و ئەمەش وشەی پەسەندکراوی (ابن تەیمیە) و قوتابیەکەیەتی (ابن القیم) و هەروەها شێخ ابن (عوسەیمین)ە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت .

## قەرز کردن بۆ قوربانی

٦.ئەوەی پارەی قوربانی نییە، ئەوا ئاساییە قەرزی بۆ بکات ئەگەر توانی دواتر قەرزەکە بداتەوە، وەکو ئەوەی فەرمانبەربێت و لە مووچەکەی بیداتەوە، یان بە قیست بیکڕێت، بەڵام ئەگەر نەیتوانی بیداتەوە ئەوا باشتر وایە قەرزی بۆ نەکات بۆ ئەوەی شتێك نەکەوێتە ئەستۆی کە واجب نەبووە لەسەری.

## کڕینی ئاژەڵی قوربانی بۆ کەسێکی تر

٧. یەکێك لەو خێر و صەدەقانەی کە سوننەتە ئەوەیە : دڵخۆشی ئەو کەسە بکەیت کە ناتوانێت قوربانی بکات بەوەی پارەکەی پێ بدەیت بیداتە حەیوانێک یان ئاژەڵێکی بەدیاری پێ بدەیت و بیکات بە قوربانی، چونکە

عوقبەی کوڕی عامر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانیەکانی لەنێوان هاوەڵانیدا دابەش دەکرد.[٢]

## حیکمەت لە ئەنجامدانی قوربانی

٨. لە حیکمەتەکانی قوربانی:

أ.خواپەرستی کردن بەو شتەی کە پەروەردگار شەرعاندویەتی.

﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾ (الحج : ٣٧) .

ب. زیندووکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر إبراهيم عليه السلام .

ج. سوپاسکردنی خوای میهرەبان لەسەر نیعمەتەکانی لەوانە نیعمەتی بەخشینی ئەو ئاژەڵە.

د. بەشداری کردنی خەڵکی شارەکان لەگەڵ حاجیان لە هەندێ لە دروشمەکانی حەج.

هـ . ئاشکرا کردن و زیندووکردنەوەی یەکێك لە دروشمەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام .

و . دڵفراوان کردن و دەرکردنی لە ڕەزیلی .

[٢] رواه البخاري (٥٥٤٧) ، ومسلم (١٩٦٥) .

ز. دڵخۆشکردنی کەس و کار و منداڵ و خێزان و دراوسێ و خزمان و هەژاران بە تایبەتی بە دابەشکردنی گۆشتی قوربانی بە سەریاندا لە ڕۆژانی جەژندا.



## قوربانی بکرێت باشە یان پارەی ئاژەڵەکە بکرێت بە خێر؟

٩. سەربڕینی ئاژەڵەکە و قوربانی کردن باشترە لە بەخشینی پارەکەی چونکە ئەو سەربڕینە دروشمێکی گەورەیە لە دروشمەکانی دینی ئیسلام و سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

وەهەروەها بۆچوونی هەرچوار مەزهەبەکەیە و تەنانەت سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێت: ئەگەر کاوڕێك بکەم بە قوربانی پێم خۆشترە لەوەی سەد درهەم بکەم بەخێر. [1]

هەروەها لەبەر ئەوەی خواپەرستیەکی سەربەخۆیە و خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾ [الكوثر] جا ئەگەر خەڵکی لەمە بترازێن و لەبری ئەمە بەرەو پارە بەخشینەکەی بچن ئەوا ئەم دروشمە گەورەیە لەکاردەکەوێت و ون دەبێت.

---

[1] مصنَّف عبدالرَّزّاق (٣٨٨/٤)

## قوربانی کردن بۆ مردوو

١٠. لەبنچینەدا قوربانی کردن بۆ زیندووەکان شەرعێنراوە، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ئەنجامیان داوە کە بۆ خۆیان و خانەوادەیان قوربانیان کردووە.

**جا قوربانی کردن بۆ مردوو دەکرێت بە دوو بەشەوە:**

**یەکەم** : ئەگەر مردووەکە وەصیێتی کردبێت بەوەی کەوا لە دوای مردنی قوربانی بۆ بکرێت: ئەوا وەصیێتەکەی جێبەجێ دەکرێت.

**دووەم** : ئەگەر مردووەکە وەصیێتی نەکردبێت بەوەی کەوا لە دوای مردنی قوربانی بۆ بکرێت: ئەوا ئەمەشیان دەبێت بە دوو بەشەوە:

أ . ئەگەر قوربانییەکە بە سەربەخۆیی بۆ مردووەکە بکرێت بە تەنها: واتە : کەسێک حەیوانێک بە جیا بکڕێت و بیکاتە قوربانی بۆ مردوویەک بەبێ ئەوەی مردوەکە پێشتر وەسێتی کردبێت ئەوا لەم حاڵەتەدا دروست نییە چونکە و هیچ بەڵگەیەکی لە سەر نەهاتووە و شێخی ئیسلام ابن تەیمیە دەفەرموێت : قوربانی کردن بۆ مردوو شتێکی ناسراو و بەربڵاو نەبووە لای سەلەف.

ب. ئەگەر مردووەکە هاوبەش بکرێت لە خێری ئەو قوربانییەی کە دەکرێت بۆ خێزانێك ئەوا دروستە ، وەکو ئەوەی کەسێك قوربانیەك بکات لەبری خۆی و خانەوادەکەی بە زیندو و مردووەوە.

**کەواتە** : گەر ویستت کەسێکی خانەوادەکەت کە مردووە لە خێری قوربانیەکە بەشدار ببێ ئەوا با نیەتت لەو قوربانیە ئەوە بێ کە خێرەکەی بۆ هەموو خانەوادەکەت بێ بە زیندووەکان و مردووەکانەوە .

## قوربانی بە چی دەکرێت؟

١١. مەرجە بۆ دروستێتی قوربانی بەوەی کە ئاژەڵەکە وشتر و مانگا و مەڕ وبزن بەهەموو جۆرەکانیەوە بێت ، بە مریشک و پەلەور و ئەوانە ناکرێت .

## کاوڕێک بۆ یەک خێزان دەبێت

١٢. کاوڕێك لەبری یەك خێزان دەبێت، جا ئەگەر سەرۆکی خێزان بیکات لەبری هەموویان یان ئافرەتەکە بیکات ئەوا هەموویان دەگرێتەوە و دروشمەکە بەجێ هێنراوە.

**ئەبو ئەیوبی ئەنصاری دەڵێت:** لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاوێک کاوڕێکی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی و خێزانەکەی و لێیان دەخوارد و لێیشیان دەبەخشی.[1]

١٣. ئەگەر هاتوو خێزانەکە چەند برایەك و منداڵەکانیشیان بوون و هاوبەش بوون و پێکەوە نانیان دەخوارد ئەوا یەك قوربانی بۆ هەموویان دەشێت، بەڵام ئەگەر هەردانەیان خانوی سەربەخۆی خۆی هەبوو ئەوا چاك وایە هەردانە وقوربانیەك بۆ خۆی بکات.

١٤. ئەگەر پیاوێك زیاد لە یەك ژنی هەبوو ئەوا یەك قوربانی بۆ هەموویان دەشێت و بەسە.

١٥. وشترێك لەبری حەوت کەس دەبێت، وە مانگاش بەهەمان شێوە لەبەر وتەکەی جابری کوڕی عبدالله ﷺ کە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە وشترێکمان سەردەبڕی بۆ حەوت کەس و هەروەها مانگایش بۆ حەوت.[1]

---

[1] رواه الترمذي (١٥٠٥) ، وصحَّحه الألباني .

[1] رواه مسلم (١٣١٨) .

١٦. دروستە خەڵکی تریش بەشداری بکەن لە مانگا یان وشترەکەدا با بەشداربووەکانیش نیەتی قوربانیان نەبێت، بەڵکو نیەتی نەزر یان گۆشت یان سەدەقە و شتی تریشیان هەبێت، چونکە هەرکەسە و بەنیەتی خۆی دەبێت ، جگە لە نیەتی گوێزەبانە چونکە گوێزەبانە و قوربانی پێکەوە کۆناکرێتەوە و گوێزەبانە دەبێ ئاژەڵێکی سەربەخۆی بۆ سەرببڕی .

١٧. دروستیشە کەمتر لە حەوت کەس بەشداربن لە وشتر یان مانگا، چونکە زۆرترینەکەی کە بریتی بێت لە حەوت کەس ئەوا بێگومان لەو ژمارەیە کەمتر دروست و ڕێگەپێدراوە.

١٨. دروست نییە زیاد لە یەك کەس بەشداربێت لە شەکێکدا، لەبەر نەبوونی بەڵگە لەوبارەیەوە هەروەکو چۆن نابێت زیاد لە حەوت کەس بەشداربن لە وشتر و مانگادا.

## باشترین جۆری ئەو ئاژەڵەی دەکرێتە قوربانی

١٩. باشترین جۆری ئەو ئاژەڵەی کە دەکرێت بە قوربانی، هەندێ لە زانایان دەڵێن باشتر وایە شەك بێت چونکە کرداری پێغەمبەری خوایە ﷺ ، و زۆرینەی زانایانیش دەڵێت: باشتر وایە وشتر بێت پاشان مانگا پاشان مەڕ و بزن.

## سیفاتی ئەو ئاژەڵەی دەکرێتە قوربانی

٢٠. لە قوربانی کردندا باش وایە قەڵەوبێت و گۆشتی زۆربێت و ناتەواوی نەبێت و بەڕووکەشیش جوان و سەرنجڕاکێش بێت ، وە باش وایە نێر بێ و شاخدار بێت.

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل دەڵێت: ئێمە لە مەدینە ئاژەڵی قوربانیمان قەڵەو دەکرد و موسڵمانانیش بەهەمان شێوە قوربانیەکانیان قەڵەو دەکرد.[1]

ئەنەسی کوڕی مالك ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کاوڕی گەورەی قەڵەو سوروتێکەڵ بەڕەشی دەکردە قوربانی.[2]

## تەمەنی ئەو ئاژەڵەی کە دەکرێت بە قوربانی

٢١. دەبێت ئاژەڵەکە گەیشتبێتە ئەو تەمەنەی کە شەرع بۆی دیاری کردووە بەم شێوەیە :

**أ. لە وشتردا** ئەوەیە کە پێنج ساڵی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو شەشەمەوە.

---

[1] ذكره البخاري في صحيحه معلَّقا (١٠٠/٧) .

[2] البخاري (٥٥٦٤) ، ومسلم (١٩٦٦) .

**ب. لەمانگادا** ئەوەیە کە دوو ساڵی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو سێ یەمەوە.

**ج. لە بزندا** ئەوەیە ساڵێکی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو دووەمەوە.

**د. لە بەرخ و کاوڕیشدا** ئەوەیە شەش مانگی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو حەوتەمەوە.

جا بۆیە پابەند بوون بەم تەمەنانەوە لەکاتی قوربانی کردندا کارێکی شەرعیە ودروست نییە لێیان لابدرێت و کەمتر لەمانە بکرێتە قوربانی بەڵام دروستە زیاد لەو تەمەنانە بکرێت.

## کاتی قوربانی کردن و سەربڕینی

٢٢. مەرجە قوربانی ئەو کاتە بکرێت کە شەرع دیاری کردووە. بەوەی لە دوای نوێژی جەژنەوە لەبەر فەرموودەی:

**((إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَنْحَرُ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا...))**[١]

---

[١] رواه البخاري (٩٦٨) ، ومسلم (١٩٦١) .

بەڕائی کوڕی عازب دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((یەکەمین کارێ کە لەم ڕۆژەماندا دەستی پێدەکەین ئەوەیە کە نوێژ بکەین، پاشان بگەڕێینەوە و قوربانیی سەربڕین، هەر کەسێ بەمجۆرەی کردبێ ئەوا لەسەر سوننەتی ئێمەیە...

## سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی پێش نوێژی جەژن

٢٣. هەرکەس قوربانی پێش نوێژی جەژن کرد ئەوا لەسەری ناکەوێت و دروست نییە لەبەر فەرموودەی: ((وَمَنْ ذَبَحَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ)). [٢] هەر کەسێکیش سەری بڕی بێ (پێش نوێژی جەژن) ئەوە گۆشتێکە و پێشکەشی ماڵ و منداڵی کردوە، ئەوە بە هیچ جۆرێ قوربانی نیە)).

## کۆتا کاتی قوربانی کردن

٢٤. کاتی قوربانی کردن بە ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن کۆتایی دێت ، بۆ نمونە گەر ڕۆژی شەممە جەژن بوو تا ڕۆژی سێ شەممە پێش خۆر ئاوابوون کاتی قوربانی دەمێنێ .

[٢] رواه البخاري (٩٦٥) ، ومسلم (١٩٦١) .

تێبینی : کەسێک پێش خۆرئاوابونی ڕۆژی چوارەم قوربانیەکەی سەربڕی ، بەڵام دابەشکردنەکەی کەوتە دوای خۆر ئاوابوونەوە ئەوا ئاساییە

## باشترین کات بۆ قوربانی کردن

٢٥. باشترین کات بۆ قوربانی کردن بریتیە لە ڕۆژی یەکەم دوای تەواوبونی نوێژی جەژن، هەر ڕۆژێك باشترە لەوەی دوای خۆی لەبەر دەستپێشخەری کردن لەکاری خێر و چاکەدا وچاك وایە دوای نەخات بۆ چوارەم ڕۆژ.

## قوربانی کردن بەشەو

٢٦. دروستە قوربانی بە ڕۆژ یان شەو سەرببڕێت، بەڵام لەسەرەتای ڕۆژەوە چاکترە بۆ ئەوەی هەژاران ببینن چونکە دروشمێکی ئاینیە.

٢٧. ئەگەر کاتی قوربانی نەما و ئەمیش قوربانی نەکردبوو ئەوا هیچی لەسەر نییە ئەگەر سوننەت بوو. بەڵام ئەگەر نەزری کردبوو ئەوا وەکو قەزاکردنەوە ئاژەڵێك سەردەبڕێت وەکو قوربانیەکە.

## لەمەرجەکانی قوربانی کردن

٢٨. لە مەرجەکانی قوربانی ئەوەیە کە سەلامەت بێت لە کەموکوڕی ، چونکە ئەوە خواپەرستیەکە و عیبادەتیش دەبێت چاك و تەواوبێت و خوا چاك و پاکە و چاك و پاکیش وەردەگرێت.

## ئەو عەیبانەی کە نابێ لە حەیوانی قوربانیدا هەبێت

٢٩. لەسوننەتدا چوار عەیب هاتووە کە ڕێگرە ئەوانیش لەم فەرموودەیەدا ئاماژەیان پێکراوە: عَنْ الْبَـرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ : (( قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ ﷺ : « أَرْبَعٌ لَا تُـجْزِئُ فِـي الأَضَاحِيِّ : الْعَوْرَاءُ الْبَيِّـنُ عَوَرُهَا ، وَالْـمَرِيضَةُ الْبَيِّـنُ مَرَضُهَا ، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّـنُ ظَلْعُهَا ، وَالْكَسِيـرَةُ الَّتِي لَا تُنْقِي » ))[1] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی نابێت و دروست نیە بکرێت بە قوربانی : ئاژەڵێك کە چاوێك یان هەردوو چاوی کوێر بێت ، و نەخۆشێکی ئاشکرا ، و شەلێکی ئاشکرا ، و لاوازێك کە ئێسکەکانی پوکابێتەوە .

٣٠. نەخۆشی ڕوون و ئاشکرا: ئەوەیە کە نیشانەی نەخۆشیەکەی پێوە دیاربێت وەکو ئەوەی تای هەبێت و وای لێکردبێت نەتوانێـت بلەوەڕێت و ئارەزووی خواردنی نەبێت و نەخۆشێکیش کە کاریگەری کردبێتە سەر گۆشتەکەی و تەندروستی تێك دابێت و برینێکی قوڵ کە کاریگەری لەسەرکردبێت. بەڵام نەخۆشی سووك ئاساییە یان شەلی و لاوازی کەم.

[1] رواه أبو داود (٢٨٠٢) ، والترمذي (١٤٩٧) ، وغيرها ، وصحَّحه الألباني .

٣١. هەر نەخۆشیەکیش هاوشێوەی ئەو عەیب و نەخۆشیانە بن یان خراپتر ئەوا هەمان حوکمیان هەیە و ناشێت بۆ قوربانی وەکو ئەمانەی خوارەوە:

- کوێر چونکە ئەمەیان خراپترە لەوەی یەك چاوی نەبێت.
- ئەو ئاژەڵەی خەریکە دەمرێت و هێشتا نەمردووە، چونکە ئەوەی تووشی بووە خراپترە لە نەخۆشی و شەلی.
- دەستێك یان قاچێکی بڕابێتەوە ئەمەشیان خراپترە لە شەلی.

٣٢. گوێ و شاخ و کلك و دووگ: ئەگەر هەریەك لەمانە نەبوون لە بنەڕەتدا واتە بەو شێوەیە لەدایك بووبێت، ئەوا دروستە بەبێ کەراهەت، و ئەگەریش بڕابێتەوە ئەوا هەر دروستن بەڵام لەگەڵ کەراهەتدا، جگە لە کاوڕ نەبێت کە ئەگەر دووگی بڕابێتەوە ئەوا دروست نییە چونکە ئەوە کەموکورتیە لە بەشێکی سەرەکی و مەبەست لە ئاژەڵەکەدا.

٣٣. مەکروهە و باش نیە ئەو ئاژەڵە بکرێـتە قوربانی کە گوێی کون کراوە یان لەت کراوە بەدرێژی یان پانی، یان هەندێ لە ددانەکانی کەوتووە یان شاخی شکاوە.

## قوربانی کردن بە ئاژەڵی خەسێنراو

٣٤. دروستە قوربانی بکرێت بەو ئاژەڵەی کە خەسێنراوە، ئەوەش لەبەر کردەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەروەها لەبەر ئەوەی گۆشتی ئەو ئاژەڵە بەو شێوەیەش هەر تێك ناچێت و بێ تام وکەم تام نابێت. هەروەکو چۆن دروستە بەو ئاژەڵەی کە نێرە و فەحلە.

٣٥. قوربانی بە دوو شت دیاری دەکرێت: بە قسە، وەکو بڵێت ئەمە قوربانیە، یان بەکڕینی بە نیەتی قوربانی.

٣٦. چەند حوکمێك لەسەر دیاری و دەستنیشان کردنی ئاژەڵی قوربانی بونیاد دەنرێت کە ئەمانەن:

- دروست نییە خاوەندارێتیەکەی بگوازرێتەوە بە کڕین یان بەخشین و شتی تر، چونکە ئەو کاتە وەکو نەزر وەهایە، مەگەر ئاڵوگۆڕ بکرێت بە ئاژەڵێکی لەخۆی چاکتر یان فرۆشتنی بۆ ئەوەی ئاژەڵێکی لەخۆی چاکتر بکڕێت.

- ئەگەر تووشی عەیب و ناتەواویەك بوو ئەوا دروست نییە بۆ قوربانی و واجبە لەسەری بیگۆڕێتەوە بە هاوشێوەی خۆی، مەگەر تووشی

عەیبێك بێت بەبێ هۆکاری کەمتەرخەمی خاوەنەکەی ئەوا سەری دەبڕێت و دروستە.

●ئەگەر ون بوو یان دزرا ئەوا واجبە لەسەری یەکێکی تری وەکو خۆی بهێنێت، مەگەر بەبێ کەمتەرخەمی خۆی بووبێت ئەوا هیچی لەسەر نییە.

●ئەگەر بێچووی بوو ئەوا هەمان حوکمی دایکەکەی هەیە و لەگەڵیدا سەردەبڕدرێت.

٣٧. هەرکەس نییەتی قوربانی کردنی هەبوو پاشان نیەتەکەی بەتاڵ کردەوە ئەوا هیچی لەسەر نییە، مەگەر ئاژەڵەکەی دەستنیشان کردبێت ئەوا دەبێت سەری ببڕێت و دروست نییە بۆی پەشیمان بێتەوە و لەموڵکی خۆی دەری بکات.

٣٨. سوننەت وایە کەسەکە خۆی ئاژەڵی قوربانیەکەی سەرببڕێت ئەگەر زانی، چونکە ئەوە عیبادەتە و نزیك بوونەوەیە لەخوا و هەروەها کرداری پێغەمبەری خوایشە ﷺ کە ئەو پێشەنگە بۆ ئێمە، بەڵام ئەگەر نەیزانی ئاژەڵ سەرببڕێت ئەوا دەیداتە دەست یەکێکی تر بۆی سەرببڕێت.

٣٩. دروستە بریکاری بکرێت لە قوربانیدا، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ شەست وسێ وشتری بەدەستی خۆی سەربڕی لە حەجی ماڵئاواییدا و دواتر عەلی ڕاسپارد ئەوانی تر سەرببڕێت هەتا گەیشتە سەد دانە.

٤٠. باشتر وایە کەسێك ڕابسپێرێت بۆ سەربڕینەکەی کە خواناس و زانابێت بە چۆنێتی سەربڕین و چاك وایە موسڵمان کەسێکی ئەهلی کیتاب دەستنیشان نەکات بۆ سەربڕینی قوربانیەکەی.

## نینۆك و موو لێ نەکردنەوە لە لاشە

٤١. هەرکەس نیەتی قوربانی کردنی هەبوو ئەوا با هیچ لەخۆی نەکاتەوە لە قژ و نینۆك و پێستی هەر لە دەستپێکردنی یەکەم ڕۆژی نۆمینەی حاجیان هەتا قوربانیەکەی سەردەبڕێت.

لە ئوم سەلەمەوە – رضي الله عنها – دەڵێت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ، وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَمَسَّ مِنْ شَعَرِهِ وَبَشَرِهِ شَيْئًا»[١].

واتە: ئەگەر دە ڕۆژی مانگی حاجیان دەستی پێکرد ویەکێکتان ویستی قوربانی بکات ئەوا با هیچ لە قژی لانەبات، ئیتر تووکی سەری

[١] : أخرجه مسلم (١٩٧٧).

بێت یان بن باڵی یاخود تووکەبەری، هەروەها نینۆکیش ئیتر هی دەست بێت یان قاچ، هەتا قوربانیەکەی سەردەبڕێت.

ئیتر لابردنەکەش بە تاشین بێت یان هەڵکەندن یان سووتاندن یان قرتاندن یان کورت کردنەوە وهەر شێوازێك و ئەو کارە دروست نییە تەنانەت بۆ مەبەستی خۆجوان کردنەوەش بێت بۆ نوێژی جەژن.

٤٢. ئەم حوکمە تایبەتە بەو کەسەی کە قوربانیەکە دەکات و کەسوکارەکەی هیچ یەکێك لەو حوکمانە نایانگرێتەوە لەنەهی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی کردووە بۆ خانەوادەکەی بەڵام لێیەوە نەهاتووە کە فەرمانی پێ کردبن بە خۆگرتنەوە لە قژ و نینۆك و پێست بڕین ورێگەپێدراوە کە تووك و نینۆك وپێست لەخۆیان بکەنەوە.

٤٣. ئەم نەهیانە تایبەتن تەنها بەو کەسەی کە قوربانیەکە دەکات، بۆیە ئەو کەسەی کە کراوە بە وەکیل و بۆ یەکێکی تر قوربانی دەکات یان وەسیەتی بۆ کراوە ئەوا نەهیەکە نایگرێتەوە.

٤٤. قوربانیکەر ئەگەر هاتوو تووك یان نینۆك یان پێستی لەخۆی کردەوە ئەوا کەفارەتی لەسەر نییە و ڕێگر نییە لەقوربانیەکەی و بەتاڵیشی

ناکاتەوە وەکو هەندێك وا گومان دەبەن، و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات.

٤٥ . ئەگەر پێویستی کرد تووك و نینۆك و پێست لەخۆی بکاتەوە ئەوا ئاساییە و دروستە وەکو ئەوەی نینۆکی بشکێت وئازاری بدات و ئەمیش بیقرتێنێت، یان قژی دابەزێتە ناو چاوی و ئەمیش بیتاشێت یان کورتی بکاتەوە بۆ مەبەستی برینپێچی و چارەسەر و هاوشێوەی ئەو کارانە و قژشانەکردنیش ئاساییە ئەگەریش قژی لێ هەڵبوەرێت.

## ئادابەکانی سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی

٤٦ . لەئادابەکانی سەربڕین ئەوەیە کەبەشێوەیەکی جوان ولەسەرخۆی ئاژەڵەکە پەلکێش بکرێت بۆ سەربڕین نەك بە توندی چونکە جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ یەکێکی بینی کە بەتوندی ئاژەڵەکەی دەبرد بۆ سەربڕین ئەمیش پێی وت : ماڵئاوا، بەهێواشی و جوانی ببە بۆ مردن.

٤٧ . تیژکردنی چەقۆ پێش سەربڕین، چونکە ئەوەی مەبەستە بریتیە لە ئاسوودەکردنی ئاژەڵەکە و سزانەدانی لەکاتی سەربڕینیدا، ئەمەش ئەو چاکە و ئیحسانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە و فەرموویەتی: " إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ

**فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ** " {رواه مسلم} واته: خوا (ﷻ) به چاك ئەنجامدانی فەرز كردوە لەسەر هەموو شتێك، ئەگەر شتێكیان كوشت بە جوانی بیكوژن، ئەگەر شتێكیان سەربڕی بە چاكی سەری ببڕن، با هەر یەك لە ئێوە تیغەكەی تیژبكات و، سەربڕاوەكە بـحەوێنێتەوە.

وە نابێت چەقۆكەش لەپێشچاوی ئاژەڵەكە تیژ بكات و ئاژەڵێك لەپێشچاوی ئاژەڵێكی تر سەرببڕێت چونكە ئەو ڕەفتارە پێچەوانەی چاكە و ئیحسانە.

٤٨. ڕووكردنە قیبلە بۆ كەسەكە وئاژەڵەكەش سوننەتە لەهەموو كاتێكدا، بەڵام بۆ هەدی وقوربانی زیاتر سوننەتە وزۆرتر جەختی لەسەركراوەتەوە، وەكو لە ابن عەبباسەوە ﷺ هاتووە كە دەڵێت: " **ليجعل أحدكم ذبيحته بينه وبين القِبلة** " واتە: با ئاژەڵەكە بخاتە نێوان خۆی و قیبلەوە.

٤٩. قوربانی عیبادەتە، عیبادەتیش نیەت دیاری دەكات لەبەر ئەم فەرموودەیە: " **إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى** " { متفق

علیه}واتە: بەڕاستی کردەوەکان بەپێی نیەتەکانن، وە بۆ هەموو کەسێکیش بە گوێرەی نیەتەکەی بۆی دەنووسرێت.

وە نیەتیش دەبێت جیاکار بێت لە نێوان عیبادەت و عادەت لەوانە قوربانی. جا تەنها کڕینی قوربانیەکە و سەربڕینی لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا بەسە بۆ ئەوەی نیەت بێت، و نیەتیش شوێنەکەی بریتیە لە دڵ و کردەوەکان نیشانەن لەسەری.

## دوعا و زیکری کاتی سەربڕینی قوربانی

٥٠. (**واجب**)ە لەسەر ئەو کەسەی شتێك سەردەبڕێت لە کاتی سەربڕینیدا بڵێت: (**بِسْمِ اللَّه**) ، بەڵام لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا سوننەتە دوای وتنی : (**بِسْمِ اللَّهِ**) بڵێت : (**وَاللَّهُ أَكْبَرَ**) ، واتە : دەڵێت : (**بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ**) .

وە دوای وتنـی (**بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ**) کە (**واجب**)ـە ، سوننەتیش وایە بڵێت : (**اللهُـمَّ تَقـبَّـلْ مِنِّـي**) خوایە لێمی وەربگری و قەبوڵی بکەی .

جا ئەوەی واجب بێت (**بسم الله**) کردنەکەیە ، وئەوانی تر سوننەتن و واجب نین .

## فرۆشتنی گۆشتی قوربانی

٥١. دروست نییە گۆشتی قوربانی و هەدی بفرۆشرێت و هەروەها پێستە وصوف و خوری و هیچ شتێکی بفرۆشرێت، چونکە ئەو شتەی کە بەندە دەیبەخشێتە خوا دروست نییە لێی پەشیمان بێتەوە و فرۆشتنیشی جۆرێکە لە پەشیمان بوونەوە. تەنانەت پێشەوا ئەحمەد دەڵێت: سبحان الله ! چۆن دەیفرۆشێت لەکاتێکدا ئەو بەخشیویەتی بەخوا ؟!

٥٢. بەڵام سوودبینین لە پێستەکەی ئەوا ئاساییە وهیچی تێدا نییە بەهەر شێوەیەك بێت، یاخود بەخشینی بە رێکخراوە خێرخوازیەکان کە دەیفرۆشن و پارەکەی دەکەن بە خێر.

## کرێی قەصاب لە گۆشتی قوربانی

٥٣. دروست نییە هیچ بەشێك لەئاژەڵەکە بدرێت بە قەسابەکە لەبەرانبەر سەربڕین وپێستکرنەکەیدا.

## چ کاتێک دروستە بەشی قەصابەکە بدرێت لە گۆشتی قوربانی

٥٤. ئەگەر قەسابەکە هەژار یان هاوڕێ و دۆست بوو ئەوا ئاساییە ئەگەر بەشی بدرێت یان وەکو دیاری بەبێ پێش مەرج ئەویش وەکو

خەڵکی تر و بەڵکو لەپێشتریشە چونکە ئەو ڕاستەوخۆ بینیویەتی و تێکەڵی گۆشت و ورد و لەتکردنی بووە و زیاتر نەفسی بۆی دەڕوات.

## خواردن لە گۆشتی قوربانی

٥٥. سوننەتە ئەو کەسەی قوربانی دەکات لە قوربانیەکەی بخوات و لێی ببەخشێت و بیدات بەخێر لەبەر ئەم ئایەتانە:

﴿ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴾

﴿ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٣٦ ﴾

هەروەها لەبەر ئەم فەرموودەیە : (( فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا)). واتە: بیخۆن و هەڵیبگرن و خێری لێ بکەن.

## گۆشتی قوربانی چەندی دەبەخشرێت و چەندی دەتوانی هەڵبگری

٥٦. زانایان ڕاجیاوازن سەبارەت بە بڕ و ئەندازەی ئەو پشکەی کە دەخورێت و دەبەخشرێت، بەڵام ئەم بابەتە فراوانە و ئەوە ئاساییە وئەوەی پەسەندە ئەوەیە: سێ یەکی بخورێت وسێ یەکی بدرێت بەهەدیە ودیاری وسێ یەکیشی بدرێت بەخێر وسەدەقە و ئەمەش لە ابن مەسعود و ابن عومەرەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەبو جەعفەری نەحاس دەڵێت: زۆربەی

زانایان لەوانە ابن مسعود وابن عومەر و عەتاء  و ثەوری پێیان باشە سێ یەك بكرێت بەخێر وسەدەقە و سێ یەکیشی بدات بەخواردن بەخەڵکی و سێ یەکیشی خۆی خێزانی بیخوات.

وە ئەگەریش زیاد لەو ئەندازەیەش بخوات بۆ خۆی و خێزانی ئەوا دروستە.

## بریکار و وەکیل لە قوربانیدا

٥٧. بریکاری لە قوربانیدا: ئەگەر خاوەن قوربانیەکە ڕێگەی دا بە بریکارەکەی کەوا لێی بخوا یان لێی بدات بەدیاری وصەدەقە ئەوا بۆی هەیە ئەگینا بەپێچەوانەوە بۆی نییە و دەبێت هەموو گۆشتەکە ڕادەستی خاوەنەکەی بکات.

وە دروستە کەسێک کە لە دەرەوەی وڵاتە کەسێک لە کوردستان بکاتە وەکیلی خۆی کە قوربانی بۆ بکات .

٥٨. واجبە بڕێك ئەگەر کەمیش بێت بکرێت بە سەدەقە و بدرێت بە هەژار و نەداران و بەڵگەی واجبێتش ئەم ئایەتەیە: ﴿ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴾

٥٩. له فەرمووده صەحیحەکاندا ئەوه سابت بووه له پێغەمبەری خواوه ﷺ لەیەکێك له ساڵەکاندا نەهی کردووه له هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی، پاشان دوای ئەوه مۆڵەتی داوه، بۆیه نەهیەکه نەسخ بۆتەوه و ئەمەش وتەی زۆرینەی زانایانه.

## سەربڕینی قوربانی له شارێکی تر

٦٠. ئەصل وایه قوربانی دەبێت لەشاری قوربانیکەردا بێت و هەرلەوێدا دابەش بکرێت، و دروستیشه لەدەرەوەی ئەو شارەشدا دابەش بکرێت لەبەر بوونی بەرژەوەندی وپێویستیەك، وەکو ئەوەی ئەگەر قوربانیەکی زۆر کرا و هەژار کەم بوو یان موسڵمانانی شارەکەی تر زیاتر هەژاربوون و پێویستی زۆرتریان بەیارمەتی هەبوو.

## قوربانی کردن لەسەفەردا

٦١. دروسته کەسێك لەسەفەریشدا بێت و لەغوربەتدا کەسێك لەشارەکەی خۆی بکات به وەکیل وبریکار و لەبری ئەم ئاژەڵێك بکڕێت وبیکات بەقوربانی و بەسەر خزم و هەژارانی شارەکەیدا دابەشی بکات.

## تێكەڵ كردنی قوربانی و گوێزەبانە بە یەک حەیوان

٦٢. قوربانی لەبری گوێزەبانە نابێت، چونكە هەریەكەیان عیبادەتێكی سەربەخۆیە و لەبەر هۆكارێكی تایبەت وجیاوازە لەوەی تر وشوێنی یەكتر ناگرنەوە ، وە هەروەها بە تێكەڵیش ناكرێ واتە یەک حەیوان نابێت سەرببڕی بە نیەتی قوربانی و گوێزەبانەش چونكە ئەوە دوو عیبادەتی جیاوازن .والله أعلم

## سەربڕینی حەیوانی قوربانی بەدەستی قەسابێكی نوێژنەكەر

٦٣. ئەو قوربانیەی كە كەسی نوێژ نەكەر سەری دەبڕێت دەكەوێتە سەر ئەوەی ئایا نوێژ نەكەر كافرە یاخود نا ؟

جا خیلاف لەنێو زانایاندا هەیە كەئایا كافرە یاخود موسوڵمانە گەر لەبەر تەمبەڵی نەیكات ، حەتمەن لەسەر بۆ چوونی ئەوانەی كەبەموتڵەقی نوێژ نەكەر بەكافر دەزانن ئەوا نابێ سەربڕاوی دەستی بخورێت ، وبەپێچەوانەشەوە لەسەر بۆ چوونی ئەوانەی پێیان وایە گەر لەبەر تەمبەڵی نوێژ نەكات كافر نابێ ئەوا سەربڕاوی دەستی حەڵاڵە .

جا بۆ دەرچوون و ڕزگار بوون لەم خیلافە باشتر وایە كەسێک یان قەسابێک قوربانیەكە سەر بڕێت كەنوێژ بكات نەک كەسی نوێژ نەكەر .

## ئاژەڵی مێینە بۆ قوربانی

٦٤. قوربانی کردن بە ئاژەڵی مێینە دروستە بەڵام ئاژەڵی نێر باشترە .

## ئەو ئافرەتەی کە شوی نەکردوە دەتوانێت قوربانی بۆ خۆی بکات؟

٦٥. قوربانی کردن سونەتێکی جەخت لەسەرکراوە لە حەقی هەموو پیاو وئافرەتێکدا کە توانایان هەبێت قوربانی بکەن.

وە بەشێک لە زانایان دەفەرمون : واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە توانای هەیە ، وەهیچ جیاوازیش نیە کە ئافرەتەکە هاوسەرگیری کردبێ یان نەیکردبێ.

### ابن حزم (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە کتێبی المحلی دا دەفەرموێت:

" قوربانی کردن بۆ ئەو کەسەی لەسەفەردایە وەکو ئەو کەسەیە کە لە ماڵی خۆیدا بێت وهیچ جیاوازی نییە ، وەبەهەمان شێوە بۆ ئافرەتیش. لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرمویەتی :(وافعلوا الخير) ، واتە: کردارە خێر وچاکەکان ئەنجام بدەن ، وە قوربانی کردنیش لە کارێکی خێر وچاکە .

## عەیبدار بوونی حەیوانی قوربانی پێش سەربڕینی

٦٦. شیخ ابن عثيمين ( ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ) دەڵێت :

بۆ نموونە : پیاوێک مەڕێک دەکڕێت بۆ قوربانی ودەس نیشانی دەکات پاشان پێی دەشکێت ، و وای لێدێت ناتوانێت لەگەڵ مەڕە ساغەکاندا ڕێ بکات ، لەم حاڵەتەدا سەری دەبڕێت ودەبێت بۆ قوربانی ؛ چونکە کاتێ دەس نیشانی دەکات وەک ئامانەتی لێ دێت ، وکاتێ کەئەمانەت بوو وخۆی دەستی نەبوو لەعەیبەکەیدا یاخود کەم تەرخەم نەبوو ئەوا هیچ زەمانێکی لەسەر نی یە ودروستە بیکات بەقوربانی. الشرح الممتع .

## ناوهێنانی خاوەن قوربانی لە لایەن قەصابەوە لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی

٦٧. پرسیار ئایا مەرجە لەکاتی سەربڕینی قوربانیدا قەصابەکە بڵێت : لەبری فڵان کەس؟

شیخ ابن عثیمین رحمه الله تعالی لەوڵامدا گوتویەتی :

گەر بڵێت : لەبری فڵان ئەوا باشترە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی سەربڕینی قوربانیدا دەیفەرموو : **(اللهم هذا منك ولك، اللهم هذا عن محمد وآل محمد)**،واتە : خودایە ئەمە لەتۆوەیە وبۆ تۆیە ، خودایە ئەمە لەبری موحەمەد وکەس وکاری موحەمەدە .

خۆ ئەگەر ئەوەش نەڵێت ئەوا نیەتەکە کافیە.

وە ئیمامی النووي رحمه الله تعالى دەڵێت :گەر کردی بەوەکیل ، وە نیەتی هێنا لەکاتی سەر بڕینەکەدا ، ئەوا بەسە وپێویست بەنیەتی وەکیل ناکات .

بەڵکو تەنانەت گەر وەکیلەکەش نەزانێت ئەو حەیوانە حەیوانی قوربانیە ئەوا زیانی نی یە ودروستە "المجموع" (٨ / ٤٠٦).

## حیکمەت چی لەوەی کە ئەگەر کەسێک بیەوێت قوربانی بکات نابێ موو لە خۆی بکاتەوە و نینۆکی بقرتێنێ؟

٦٨. زانای پایەبەرز محمد بن صالح العثيمين ( ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ) لەوەڵامدا دەفەرموێت:

یەکەم :لە نیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەر بەندەکانی ، ئەوەیە کە کاتێک خەڵکی شار وشارۆچکەکان پڕۆسەی حەج ئەنجام نادەن بەهۆی بەژداری نەکردنیانەوە، شەرع فەرمانی کردوە بەوانەی کە لە شار وشارۆچکەکانن قوربانی ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی لەگەڵ حاجیاندا هاوبەشی بکەن لەهەندێک لەو خواپەرستیەی کە لەو پڕۆسەیەدا ئەنجامی دەدەن.

دووەم :هەروەها وەکو چۆن ئەو کەسەی کە قوربانی ئەنجام دەدات هاوبەشی کردوە لەگەڵ هەندێک لەو خواپەرسیانەی کە حاجی ئەنجامی دەدات کە سەربڕینە، بەهەمان شێوە خۆ گرتنەوەی لە موکردنەوە ونینۆک بڕین هاوبەشیە لەگەڵ حاجیاندا بەوەی کە ئەوانیش لە کاتی ئیحرامدا خۆیان لە موو لەخۆکردنەوە ونینۆک بڕین دەگرنەوە.

## ڕێگر و بەربەستەکانی نەکردنی قوربانی

٦٩. هەندێك بۆچوونی هەڵـە بووەتـە هـۆی دوور کەوتـنەوەی زۆرێـك لە موسڵمانان لە ئەنجامدانـی قـوربانی کە بریتین لە:

* زۆربەی خەڵك وا دەزانن یان وا تێگەینراون !کە (مەڕێك یان بزنێك) تەنها بۆ یەك نەفەرە!!! بەڵام لە ڕاستیدا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو ئاژەڵێکی (مەڕێك یان بزنێك)ی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی و خێزانی و منداڵەکانی.

* زۆربەی خەڵك وا دەزانن یان وا تێگەینراون !کە نابێت خاوەنی قوربانییەکە و منداڵەکانی لە گۆشتەکەی بخۆن !بەڵام لە ڕاستیدا لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ ڕوونکراوەتەوە کە خاوەنی قوربانییەکە

سوننەتە خۆی لـێی بخوات و دروستیشە (سێیەکی حەیوانەکە) بخوات و (سێیەکی) تری هەڵبگرێت و ئەو (سێیەکە)کەی تری ببەخشێت.

لە ڕاستیدا ئەم دوو بۆچوونە هەڵەیە دوو ڕێگری زۆر کاریگەر و بە هێزن بۆ نەکردنی قۆچ و قوربانی لە ناو موسڵماناندا !

ـ چونکە زۆربەی موسڵمانان دەڵێن :ئێمە ناتوانین بۆ سەری هەر نەفەرێـك قوربانی ئەنجام بدەین لە بەر ئەوەی ئەرکێـکی قورس و گرانە ! ئەمەش زۆر ڕاستە و پێچەوانەشە بۆ فەرموودەکەی پێشوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو ئاژەڵێکی (مەڕێك یان بزنێك)ی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی و خێزانی و منداڵەکانی.

ـ هەروەها زۆربەی موسڵمانان دەڵێن :ئێمە ئەگەر دروست بێت خۆمان لە گۆشتی قوربانییەکە بخۆین و دروستیش بێت (سێیەکی حەیوانەکە) بخۆین و (سێیەکی) تریشی هەڵبگرێن ئەوا هەموو ساڵێك قوربانی دەکەین، چونکە وەك ووتراوە ئەو کاتە دەبێتە :(جەژنێك و دوو قوربان).

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : موژدە بدەن و خەڵك ڕاومەنێن، وە کار ئاسانی بکەن و شت لە سەریان قورس مەکەن.

* زۆربەی خەڵك وا دەزانن یان وا تێگەینراون کە لەتەمەندا تەنها یەك جار قوربانی دەکرێت !!!بەڵام لە ڕاستیدا وانیە و بەڵکو (سوننەتێکی جەخت لەسەرکراوە) بەڵکو هەندێک لەزانایان دەفەرمون (واجبە) هەموو خێزانێك هەموو ساڵێك قوربانی بکەن مادام تواناى داراییان هەبێ .

## هەندێک لە هەڵە و بیدعە و داهێنراوەکانی قوربانی

٧٠. قوربانی ئەو پەرستشە پیرۆزە و ئەو دروشمە گەورەیەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە ـ وەك هەموو جۆرەکانی تری پەرستشەکان و دروشمەکانی ئاینە پاك و بێ کەم و کوڕییەکەی ئیسلام ـ بێ بەش نەبووە لە کۆمەڵێك بیدعەی ڕەش و داهێنراوی نەفامەکان و ئەوانەی لایان داوە لە ڕێگای ڕاست، بۆیە بە پێویستم زانی ئاگادارت بکەمەوە لە بیدعە و داهێنراوەکانی قوربانی.

**لەوانە :**

١. قوربانی کردن بە مەبەستی خۆ دەرخستن و شانازی کردن بە سەر خەڵکەوە .

٢. هێنانی مەلایەك بۆ ئەوەی ئامادەی سەربڕینی قوربانیەکە بێت!

٣. چاو ڕەشتنی حەیوانی قوربانی پێش سەربڕینی!

٤. پارچە پەڕۆیەکی سوور دەخەنە ملی حەیوانەکە!

٥. مووروو و بەن بەستن بە شاخی حەیوانەکەوە!

٦. شەکری کولۆ یان نوقڵ یان شیرینی دەخەنە ناو دەمی حەیوانەکە لە کاتی سەر بڕینیدا!

٧. دوعا و ویرد خوێندن بە گوێی حەیوانەکەدا!

٨. نەووتنی (بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ) لە کاتی سەر بڕینی قوربانیەکەدا بە هۆی مەشغووڵ بوون بە هەندێك ویردی تری نا شرعیەوە!

٩. ووتنی نیەت بە زمان لە کاتی سەر بڕینیدا، چونکە جێگای نیەت تەنها دڵە.

١٠. ووتنی (لەڕێی خوا و مەولوودی پێغەمبەر ﷺ) لەکاتی سەر بڕینی قوربانیەکەدا، چونکە دەبێت تەنها بڵێت :(بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ) وەك لە سوننەتی پێغەمبەردا هاتووە ﷺ.

١١. نەخواردنی گۆشتی قوربانی لە لایەن خاوخێزان و خاوەنی قوربانیەکەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (كُـلُوا )واتە :لێی بخۆن.

١٢. هەندێك لە خەڵك دەڵێت : ئەگەر حەیوانێك پێش جەژن دیاری بکرێت بۆ قۆچ و قوربانی ئەوا نابێت لـێی بخۆیت و دەبێت هەمووی ببەخشیت !!!

ئەم شتە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبووە و پێچەوانەشە بۆ فەرموودەی (**كُـلُوا** ) وە ئەم بیدعەیەش بۆتە هۆی دوور کەوتنەوەی زۆرێك لەو جۆرە خەڵکانە لە ئەنجامدانی قوربانی کردن !

١٣. فرۆشتنی پێستی قوربانیەکە یان بەخشینی بە قەصابەکە لە جیاتی کرێی سەر بڕینەکە.

١٤. دابەش کردنی گۆشتی قوربانییەکە بە سەر هەموو دراوسێکاندا ئەگەر چی دەست کورت و موحتاجیش نەبن لە بەر لۆمە و تانەی خەڵك، چونکە صەدەقە تەنها بۆ فەقیر و هەژارانە.

١٥. شاردنەوەی خوێنی قوربانییەکە لە ژێر خاکدا، بە مەبەستی ئەوەی کە ئەو خوێنە تێکەڵ نەبێت بە ئاوەڕۆ (مەجاری) چونکە وا دەزانن خوێنی قوربانی موبارەکە.

١٦. لە هەڵەکانی خەڵکی لە گۆشتی قوربانی یەکسانی لە دابەش کردنی گۆشتی قوربانییەکەدا بە سەر هەموو ماڵەکاندا وەك یەك !!!ئەمەش بووەتە هۆی نەمانی دادپەروەری لە نێوان ئەو خێزانانەی کە ژمارەیان زۆرە بەرامبەر بەوانەی کە ژمارەیان کەمە! یانی نابێت ماڵێکی هەشت کەسی و ماڵێکی دوو کەسی وەکو یەک گۆشتیان پێ بدەی .

**کەواتە** :دەبێت بەش و پشکی ئەو خێزانانەی کە ژمارەیان زۆر ترە زیاتر بێت لەوانەی کە ژمارەیان کەمترە . والله أعلم .

# ئاگاداری

## پرسیارەکان لەم دوو بەشەی خوارەوە دێتەوە و پێویستە بە وردی بیخوێنیتەوە

---------------------------------------

## بەشی یەکەم

## پوختەی فەزڵ و گەورەیی

## دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان

### لەگەڵ ئەو کردەوانەی کە سوننەتن لەم دە ڕۆژەدا ئەنجام بدرێن

**یەکەم :** خوای گەورە لە قورئاندا سوێندی پێ خواردووە و فەرموویەتی :

﴿وَالْفَجْرِ ۝١ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ۝٢﴾ [سورة الفجر].

**دووەم :** چاکەکردن لە دە ڕۆژی سەرەتایی مانگی حاجیان لەهەموو ڕۆژەکانی تری ساڵ باشترە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : هیچ ڕۆژانێك نییە کردەوەی چاکە تێیدا خۆشەویست تر بێت لە لای خوا وەکو ئەم دە ڕۆژەی مانگی حاجیان ، وتیان : تەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ؟ فەرمووی : تەنانەت جیهادیش لە پێناوی خوادا ، تەنها مەگەر پیاوێك نەبێت کە بە خۆی و ماڵ و سامانییەوە دەربچێت بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا و هیچیش لەوانە نەگەڕێتەوە.

**سێیەم :** یەکێکی تر لەفەزڵ وڕێزەکانی ئەم دە ڕۆژە ئەوەیە: ڕۆژی عەرەفەی تێدایە ، ئەو ڕۆژەی کەخوای پەروەردگار دینی تیادا کامڵ وتەواو کرد ، ونیعمەتی خۆی بۆ موسوڵمانان تەواو کرد .

## * ئەو کردەوانەی کە سوننەتن لەم دە ڕۆژەدا ئەنجام بدرێن :

**١ ـ زۆر ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان بە گشتی :** وەکو : قورئان خوێندن و زیکر کردن و فەرمان کردن بە چاکە و قەدەغە کردنی خراپە و جگە لەمانەش.

**أ / قورئان خوێندن :** یەکێک لە بازرگانییە پڕ خێر و قازانجەکان قورئان خوێندنە لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجیان ، چونکە خوای پەروەردگار بەهەر پیتێک دە خێر وچاکەت بۆ دەنوسێت ، و بێ گومان لەم دە ڕۆژە خێری زیاتری هەیە.

**ب / زیکر کردن :** بە هەمان شێوە زیکری خوایش لە هەموو کاتێکدا سوننەتە و خێر و پاداشتی زۆر و گەورەیە ، بەڵام لەم دە ڕۆژە خێرترە و خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ ﴿٢٨﴾﴾ [الحج] واتە : زیکری خوا بکەن لە ڕۆژە زانراوەکاندا (کە بریتین لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی جاجیان) .

**٢ ـ نوێژ کردن :** بەوەی کە زوو بچیت بۆ نوێژە جەماعەتەکان و پەلە و پێشبڕکێ بکەیت بۆ ڕیزی یەکەم ، هەروەها ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکانی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان و شەونوێژ و زوحا و سوننەتی دەست نوێژ ...

**٣ ـ خێر و صەدەقە کردن ماڵ بەخشین :** پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (الصَّدَقَةُ تُطْفِيءُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ) واتە: خێرو صەدەقەو ماڵ بەخشین لە پێناوی پەروەردگاردا تاوان دەکوژێنێتەوەو نایهێڵێ، هەروەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوەو نایهێڵێ.

**٤ ـ ڕۆژوو گرتن :** هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویانە: پێغەمبەر (ﷺ) نۆ ڕۆژەکەی مانگی حاجیان بە ڕۆژوو دەبوو

**٥ ـ ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە بە تایبەت :** سوننەت وایە بۆ ئەو کەسانەی کە نەڕۆیشتوون بۆ حەج و لە عەرەفەدا نین و لە ماڵدان کەوا بە تایبەت لە ڕۆژی عەرەفەدا (٩ / ذو الـحجة) بە ڕۆژوو بن ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ))واتە : ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە چاوەڕوانم کە خوا بیکاتە مایەی کەفارەت و سڕینەوە و لێخۆشبوونی تاوانی ساڵێك لە پێشییەوە و ساڵێکیش لە پاشییەوە (واتە: ببێتە کەفارەتی تاوانی دوو ساڵ) .

**٦ ـ عومرە کردن :** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : عومرە دوای عومرە کەفارەت و ڕەشکەرەوەی گوناهی نێوانیانە .

**٧. حەج کردن :** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمـوویەتی : حەجێکـی چـاك پاداشـتی نـیە تەنها بەهەشت نەبێت.

**٨ ـ زیکر کردن بە ووتی : (الله أكبر ...)** لەم دە ڕۆژەدا هەموو کاتێك و بەم شێوازە : (الله أكبر ، الله أكبر ، الله أكبر ، لا إلـهَ إلاَّ الله ، والله أكبر ، الله أكبر ، ولله الـحمد)

**٩ ـ خۆ ئامادە کردن بۆ قوربانی ئەنجام دان :** ئەگەر کەسێك ویستی وا بوو قوربانی بکات ئەوا نابێت لە تووکی هەموو لاشەی و نینۆکەکانی لابەرێت یان لـێ ی بقرتێنێت و کەمی کاتەوە ، لە سەرەتـــای مانگی حاجییانەوە (ذو الحجة) تاوەکو قوربانییەکەی سەردەبڕێت

**١٠ ـ قوربانی کردن لە ڕۆژی جەژندا :** پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لە ماڵ دەرنەدەچوو هەتا خواردنی نەخواردایە ، وە ڕۆژی جەژنی قوربان خواردنی نەدەخوارد هەتا دەگەڕایەوە لە نوێژی جەژن ئەنجا لە قوربانییەکەیی دەخوارد .

تێبینی : هەرچەندە قوربانی ئەنجامدان لە سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنیشدا (أيام التشريق) دروستە بەڵام باشتر و خێرتر وایە کە لە ڕۆژی جەژندا سەرببڕێت

لەبەر سونەتەکە و ئەنجا دەشکەوێتە نێو دەیەم ڕۆژی مانگی حاجیانەوە کە کردەوەی چاکە تێیدا فەزڵ و خێرەکەی تایبەتە ، بۆیە باشتر وایە لە دەیەمین ڕۆژدا قوربانی ئەنجامبدرێت .

**لەکۆتاییدا :** پێویستە لەسەر تۆی موسوڵمان ئاگاداری ئەم دە ڕۆژە بیت و لەدەستی نەدەیت ، و کردەوەی چاکەی زۆر تێدا ئەنجام بدەی ، و کاتەکانی بە شتی باش و خێر بەڕێ بکەی ، و ئاممان ئاگادار بن لەبەفیڕۆدانی کات لەم دە ڕۆژەدا و خۆ سەرقاڵ کردن بەشتی خراپ و بێ سوودەوە هاوشێوەی نوستنی زۆر ، و وتی و وتی ، و تەماشاکردنی کەناڵەکان ، و سەرقاڵ بوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە ، چونکە ئەم کاتانە غەنیمەت ودەستکەوت گەلێکی زۆر گەورەن و گەر لەدەستت بچێ قەرەبوو ناکرێنەوە .

## بەشی دووەم

# پوختەی

# حوکم و ئادابەکانی قوربانی کردن

١. قوربانی واتە سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی لە جۆری وشتر، مانگا، مەڕ وبزن لە ڕۆژانی جەژنی قورباندا وەکو نزیك بوونەوەیەك لەخوا.

٢. قوربانی کارێکی شەرعییە و نزیك بوونەوەیەکی گەورەیە لە خوای پەروەردگار، وە دروشمێکی ئاشکرای ئاینی پیرۆزی ئیسلامە.

٣. قوربانی لای زۆربەی زانایان سوننەتی جەختلێکراوە و هەندێکیش لە زانایان بۆ ئەوە ڕۆیشتوون کە واجبە ، بۆیە باش وایە هەرکەس توانای هەیە و خوای گەورە ماڵی پێداوە با هەموو ساڵێک قوربانی بکات و دڵی هەژاران خۆش بکات .

٤. ئەوەی پارەی قوربانی نییە، ئەوا ئاساییە قەرزی بۆ بکات ئەگەر توانی دواتر قەرزەکە بداتەوە وەکو ئەوەی کە موچەی هەبێ.

٥. حیکمەت لە ئەنجامدانی قوربانی زیندووکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر إبراهیم علیه السلام ، و سوپاسکردنی خوای میهرەبان لەسەر نیعمەتەکانی ، و دڵخۆشکردنی کەس و کار و منداڵ و خێزان و دراوسێ و خزمان و هەژاران بە تایبەتی بە دابەشکردنی گۆشتی قوربانی بە سەریاندا لە ڕۆژانی جەژندا.

٦. قوربانی کردن باشتر و خێرترە لە بەخشینی پارەی ئاژەڵەکە بەفەقیر چونکە ئەو سەربڕینە دروشمێکی گەورەیە لە دروشمەکانی ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

٧. قوربانی کردن بۆ مردوو : لەبنچینەدا قوربانی کردن بۆ زیندووەکان شەرعێنراوە، وەکو پێغەمبەری خوا وﷺ هاوەڵانی ئەنجامیان داوە کە بۆ خۆیان و خانەوادەیان قوربانیان کردووە ، جا ئەگەر مردووەکە وەصێتی کردبێت بەوەی کەوا لە دوای مردنی قوربانی بۆ بکرێت: ئەوا وەصێتەکەی جێبەجێ دەکرێت ، بەڵام ئەگەر مردووەکە وەصێتی نەکردبێت ئەوا مردووەکە هاوبەش دەکرێت لە خێری ئەو قوربانییەی کە دەکرێت ، وەکو ئەوەی کەسێك قوربانیەك بکات لەبری خۆی و خانەوادەکەی بە زیندو و مردووەوە.

٨. کاوڕێك لەبری یەك خێزان دەبێت، جا ئەگەر سەرۆکی خێزان بیکات لەبری هەموویان یان ئافرەتەکە بیکات ئەوا هەموویان دەگرێتەوە و دروشمەکە بەجێ هێنراوە ، **ئەبو ئەیوبی ئەنصاری دەڵێت:** لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاوێک کاوڕێکی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی و خێزانەکەی و لێیان دەخوارد و لێیشیان دەبەخشی.

٩. لە قوربانی کردندا باش وایە قەڵەوبێت و گۆشتی زۆربێت و ناتەواوی نەبێت و بەڕووکەشیش جوان و سەرنجڕاکێش بێت ، وە باش وایە نێر بێ و شاخدار بێت.

١٠. دەبێت ئاژەڵەکە گەیشتبێتە ئەو تەمەنەی کە شەرع بۆی دیاری کردووە بەم شێوەیە :

أ. لە وشتردا ئەوەیە کە پێنج ساڵی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو شەشەمەوە.

ب. لەمانگادا ئەوەیە کە دوو ساڵی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو سێ یەمەوە.

ج. لە بزندا ئەوەیە ساڵێکی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو دووەمەوە.

د. لە بەرخ و کاوڕیشدا ئەوەیە شەش مانگی تەواوکردبێت و چووبێتە ناو حەوتەمەوە.

١١. مەرجە قوربانی ئەو کاتە بکرێت کە شەرع دیاری کردووە. بەوەی لە دوای نوێژی جەژنەوە سەرببڕێت و پێش نوێژ دروست نیە .

١٢. کۆتا کاتی قوربانی کردن بە ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن کۆتایی دێت ، بۆ نمونە گەر ڕۆژی شەممە جەژن بوو تا ڕۆژی سێ شەممە پێش خۆر ئاوابوون کاتی قوربانی دەمێنێ .

١٣. باشترین کات بۆ قوربانی کردن بریتیە لە ڕۆژی یەکەم دوای تەواوبونی نوێژی جەژن.

١٤. دروستە قوربانی بە شەو سەرببڕێت، بەڵام لەسەرەتای ڕۆژەوە چاکترە بۆ ئەوەی هەژاران ببینن چونکە دروشمێکی ئایینیە.

١٥. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی نابێت و دروست نیە بکرێت بە قوربانی : ئاژەڵێك کە چاوێك یان هەردوو چاوی کوێر

بێت، و نەخۆشێکی ئاشکرا ، و شەلێکی ئاشکرا ، و لاوازێك كە ئێسكەكانی پوکابێتەوە .

١٧ . دروستە قوربانی بکرێت بەو ئاژەڵەی کە خەسێنراوە .

١٨ . سوننەت وایە کەسەکە خۆی ئاژەڵی قوربانیەکەی سەرببڕێت ئەگەر زانی .

١٩ . هەرکەس نیەتی قوربانی کردنی هەبوو ئەوا با هیچ لەخۆی نەکاتەوە لە قژ و نینۆك و پێستی هەر لە دەستپێکردنی یەکەم ڕۆژی نۆمینەی حاجیان هەتا قوربانیەکەی سەردەبڕێت.

٢٠ . لەئادابەکانی سەربڕین ئەوەیە کەبەشێوەیەکی جوان ولەسەرخۆی ئاژەڵەکە پەلکێش بکرێت بۆ سەربڕین نەك بە توندی ، وە تیژکردنی چەقۆ پێش سەربڕین، وە نابێت چەقۆکەش لەپێشچاوی ئاژەڵەکە تیژ بکات و ئاژەڵێك لەپێشچاوی ئاژەڵێکی تر سەرببڕێت چونکە ئەو ڕەفتارە پێچەوانەی چاکە و ئیحسانە ، وە ڕووکردنە قیبلە بۆ کەسەکە وئاژەڵەکەش سوننەتە لەهەموو کاتێکدا،

٢١. (واجب)ە لەسەر ئەو کەسەی شتێك سەردەبڕێت لە کاتی سەربڕینیدا بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ) ، بەڵام لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا سوننەتە دوای وتنی : (بِسْمِ اللَّهِ) بڵێت : (وَاللَّهُ أَكْبَرَ) ، واتە : دەڵێت : (بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ) .وە دوای وتنی (بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرَ) ، سوننەتیش وایە بڵێت : (اللهُمَّ تَقَبَّلْ مِنِّي) خوایە لێمی وەربگری و قەبوڵی بکەی.

٢٢ . دروست نییە هیچ بەشێك لەئاژەڵەکە بدرێت بە قەسابەکە لەبەرانبەر کرێی سەربڕینەکەدا.

٢٣. سونئەتە ئەو کەسەی قوربانی دەکات لە قوربانیەکەی بخوات و لێی ببەخشێت و بیدات بەخێر .

٢٤. دروستە گۆشتی قوربانی سێ یەکی بخورێت وسێ یەکی بدرێت بەهەدیە ودیاری وسێ یەکیشی بدرێت بەخێر وسەدەقە.

٢٥. قوربانی و گوێزەبانە بە یەک ئاژەڵ نابێت، واتە یەک حەیوان نابێت سەرببڕی بە نیەتی قوربانی و گوێزەبانەش چونکە ئەوە دوو عیبادەتی جیاوازن .والله أعلم

٢٦. باشتر وایە کەسێک یان قەسابێک قوربانیەکە سەر بڕێت کەنوێژ بکات نەک کەسی نوێژ نەکەر ، وە ئەگەر نوێژ نەکات و بڕوای بەنوێژ نەبێ دروست نیە ئاژەڵی قوربانی سەربڕێت ، بۆیە ئاگاداربە و بزانە چ کەسێک قوربانیەکەت بۆ سەردەبڕێت.

٢٧. قوربانی کردن بە ئاژەڵی مێینە دروستە بەڵام ئاژەڵی نێر باشترە .

٢٨. ئەو ئافرەتەی کە شوی نەکردوە و پارەی خۆی هەیە دەتوانێ بۆ خۆی قوربانی بکات .

٢٩. شاردنەوەی خوێنی قوربانی و پەڕوی سور کردنە ملی ئاژەڵی قوربانی بیدعەیە و شتی وا لە شەرعدا نەهاتوە .



## برا و خوشکانی بەڕێز :

ئامۆژگاریتان دەکەین بە دابەزاندنی ( ئەپڵیکەیشنی وەڵامەکان) کە زیاتر لە (٣٥٠٠) پرسیاری وەڵامی شەرعی تێدایە لە هەموو بوارەکانی شەریعەتدا، یەکجار دایبەزێنە و (٣٥٠٠) پرسیار و وەڵامی شەرعی بەبێ ئینتەرنێت بخوێنەوە ، وە بۆ هەردوو سیستەمی ios و android بەردەستە ، ئەتوانن لە ڕێگەی ئەم لینکەوە دایبەزێنن .

http://onelink.to/ekb٦٣b

بۆ زانیاری زیاتر پەیوەندی بکەن بە

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨



## بە بۆنەی هاتنی پشووی هاوینەوە

پاکێجی پەروەردەی منداڵی موسڵمان کە پێک هاتووە لە کۆمەڵە کتێبێکی پەروەردەیی بۆ خولی هاوینەی منداڵان بە زمانی شرینی کوردی و بە دیزاینێکی ناوازە و جوان ئامادە کراوە

بۆ سێ ئاستی جیاواز لە تەمەنی شەش ساڵی تاوەکو پانزە ساڵی

گەیاندن بۆ سەرجەم شارەکان هەیە بە داشکاندنێکی تایبەتەوە

بۆ داواکردن پەیوەندی بکەن

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨



پاکێجی

# پەروەردەی منداڵی موسڵمان

بۆ خولی هاوینەی مزگەوتەکان

























بۆ داواکردن: 0770 151 7378

لە بڵاوکراوەکانی ماڵپەڕی بەهەشت www.ba8.org